محوی

# تەمەنی زێڕین

## بەفیڕۆی نەدەین

### توێژینەوەیەك لەسەر قەیرەیی

هۆکارەکانی

زیانەکانی

چارەسەری

نووسینی
فەرمان خەرابەیی

چاپی دووەم
١٤٣١ك ٢٠١٠ز




# با بە فیڕۆی نەدەین

توێژینەوەیەك لەسەر قەیرەیی

هۆكارەكانی + زیانەكانی + چارەسەری

نووسینی

فەرمان عزیز نەجار خەرابەیی

١٤٣١. ك     چاپی یەكەم     ٢٠١٠. ز



پێناسی کتێب

ناوی کتێب : تەمەنی زێرین.

بابەت: کۆمەڵایەتی

نووسینی: فەرمان خەرابەیی

چاپ: یەکەم – هەولێر/ ٢٠١٠

تیراژ: (***) دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی

( ١٩٥٩ ) ساڵی (٢٠١٠)ی دراوەتێ





# پێشـــەکی نووسەر

خوێنـەری بـەڕێز ئـەم نامیلکـەی بـەر دەستت توێژینـەوەیـەکی بـچوکە لەسەر قەیرەیی و هۆکار و زیان و چارەسـەرەکەی، ئەگـەر بڕوانین دەبیـنین عێراق بوو بە یەکەم لە ژمارەی قەیرەیی کچان.. لە تازەترین ئامار[1] کە کراوە دەرکەوتووە کە زۆرترین ژمارەی قەیرە کچان لە عێراق تۆمار کراوە.

لە توێژینەوەیەکدا کە پسپۆڕێکی ئەردەنی ئەنجامی داوە دەرکـەوتووە ڕێـژەی هـەرە زۆری قـەیرەیی لـە عێراقـدابووە کـە (٨٥٪)ی کـچانی عێـراق، تەمــەنیان لــە (٣٥) ســاڵ تێپــەڕیوە و هێــشتا شــوویان نــەکردووە و بــە قەیرەیی ماونەتەوە[2].

بۆیە خوشکی بەڕێز: نەکەی تەمـەنی زێڕینـی خۆت بە فیڕۆ بەدەی، ئاگاداری ئەو هۆکارانەبە کە بەرەو قەیرەیت دەبات، نەکەی تەمەنی جوانت بفەوتێنی..

بـرا و بـاوکی بـەڕێز: تـۆش نەکـەی ببیـە هۆکارێـك بـۆ بـە فیڕۆدانـی تەمەنی زێرینی خۆشکەکەت یان کچەکەت، بەوەی ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی قەیرەیی لە پێشی زیندوو بکەیەوە و ڕێگری شووکردنی بیت.

نووسەر

٢٠١٠/١٠/١

---

(1) ئاماری سالی: (2010).

(2) ڕۆژنامەی هەولێر (2010-05-11): http://www.hawler.in/more.php?id=6414



# قەیره کێیـــە؟

لە زمانی عەرەبیدا بە (قەیـــره) دەگوترێ (العنوســـة) واتــە: قـەیره، کـــە ئـەو گەنجانـەن تـاکو تەمـەنێکی درەنـگ ژیانی هاوسەرگیریان پێك نەهێناوە، بەڵام ئێستا کە وترا قەیـره یەکڕاست ئینسان بیری بۆ لای کچان دەچێت نەك کوڕان، چونکە زیـاتر ووشـەی قەیـره بـۆ کـچان بـە کـاردێ، ئـەوەش بـۆ ئـەوە دەگەڕێتـەوە کە لـە زۆربـەی کۆمـەڵگاکان، بگـــره بـە کۆمـەڵگای کوردیـشەوە کـوڕ هـەر چـەندە تەمـەنی گـەورە بێـت دەتـوانێ ئافرەتێکی (١٠) ساڵ لـە خۆی بچوکتر بگـره زیـاتریش بخوازێت، بەڵام زۆر کەم هەیە کوڕێك ڕازی بێت بە کچێك کە لە خۆی گەورە تربێـت، هـەر بۆیـەش ئەگـەر کچ لـە تەمـەنی شووکردنی عـادەتی خۆی تێ پەڕێ پێی دەڵێن قەیـره.

# زیانــــــەکانی قەیرەیی

دکتۆرە (فوزیة الدریع) دەڵێت: هەر کچێك تەمەنی تێی پەڕاندبێ و شووی نەکردبێت، ئەوە هەموو کاتێك لە حاڵەتێکی دەروونی زۆر ناخۆشدا دەژی، بەڵام لە هێندێ کاتدا ئەوە زۆر ئازاری پێ دەگا، لەوانە:

✍ هەر کاتێك هاوڕێیەکی شوو بکات، ئەو ئازار دەخوات وا هەست دەکات ئەو ماوەتەوە و هەموو هاوڕێیەکانی شوویان کرد تەنها ئەو ماوە.

✍ هەر کاتێك لە خانەوادەکەیدا منداڵێك ببێت، ئەو ئازار دەخوات، چونکە هەستی دایکایەتی دەبزوێ و وا هەست دەکات ئەو لە سۆزی منداڵ بێ بەشە.

✍ هەر کاتێك بێ نوێژی مانگانە دەبینێت وەکو ئینزارێکی سوور پێی دەڵێت: هێلکۆکەکانت بە فیڕۆ چوو بە بێ ئەوەی منداڵیشت ببێت.

✍ هەر کاتێك ساڵێك لە تەمەنی دەڕوات وەك زلەیەك وایە بە بنا گوێدا بدات پێی بڵێت: ساڵێکی تریش گەورەبوو و شووت نەکرد.

✍ ڕاگەیاندن بە هەموو بە شەکانیەوە کە بە نیەتێکی باش باسی کێشەی قەیرەیی دەکەن ئەو ئازاری پێ دەخوات، ئەگەر

بێتوو ڕاگەیاندن بەباشیش باسی ئەو بابەتە بکات، ئەو هەر دەروونی پێی ئازار دەخوات، ئەو کاتێك ڕۆژنامەیەك دەبینێت باسی قەیرەیی دەکات ئازار دەخوات، کە ڕادیۆ دەکاتەوە باسی قەیرەیی دەکات ئازار دەخوات، کە تەلەفیزیۆن دەکاتەوە باسی قەیرەیی دەکات ئازار دەخوات، هەمووی باس لە ئێش وئازاری ئەو دەکات.

شێخ (منصور المنهالی) سەرۆکی بەشی (الوعظ والإرشاد) لە ئیمارات دەڵێت: ئافرەتی قەیرە ئەگەر دین و ئیمانی نەبێت، ئەوە تووشی خراپە کاری دەبێت.

دکتۆر (محمد الرواشدة) مامۆستای چارەسەری سروشتی دەڵێت: شووکردنی درەنگ چەند زیانێکی لە منداڵبوون و تەندروستی منداڵدا هەیە، هێندێ لە توێژینەوەکان دەریان خستووە، کە سکی دوای (٤٠) ساڵی زۆر جار منداڵی شێواوی لێ دەکەوێتەوە، سکیش دوای (٣٥) ساڵی لە (260) منداڵ، دانەیەکی مەنغولی دەردەچێت.

دکتۆر (رامز طه) کە (استشاري الطب النفسي)ە

دەڵێت: ئەو کچەی چەندین داوای دێت هەر ڕەتی دەکاتەو، بەو کارەی وادەکات قسەی خەڵکی بێتە سەری، هەر بۆیە وای



لێدیٚ کەس نایەتە داوای.

پرسیاریان لە (دکتور/ فلاح الخطیب ـ استشاري ورئیس قسم علاج الأورام ) کرد، ئەو هۆکارە سەرەکیانە چین کە ئافرەتان پێی تووشی سەرەتانی مەمك دەبن؟

چەند دانەی لیٚ ژمارد، یەك لەوانە زۆرێك لەو ئافرەتانە دەگرێتەوە کە لە تەمەنی دوای (٣٠) سالٚی منداڵی یەکەمیان دەبێت.

بەلٚیٚ: هەر لە زیانەکانی قەیرەیی ئەوەیە، زۆر جار کچی قەیرە بەرەو بیٚ ڕەوشتی دەڕوات، ئەمەش هەموو قەیرەیەك ناگرێتەوە، چونکە کەسێك بڕوای بە تینی بە خوا هەبێت و ئیمانی پتەو بێت، ئەوە بێگومان ئارام دەگرێت، وا ناکات لەبەر هەڵەیەك کە تێی کەوتووە خۆی تووشی توڕەیی خوا بکات.

# هۆکارەکـــــانی قەیرەیی

## یەکەم: گەڕان بە دوای دەوڵەمەند:

یـەکێك لـەو هۆکارانـەی کـە ئافرەت پێـی دووچاری قـەیرەی دەبێتەوە، گەڕانە بەدوای کەسێکی دەوڵەمەند، زۆر ئافرەت هەیە چەندین داوای دێت کەچی بەبیانوی ئەوەی دەوڵەمەند نیە ڕەتی دەکاتـەوە، یـان ماڵـەوەیان نایـدەن چـونکە دەوڵەمەنـد نیـە، بـەم شـێوە چـەندین داواکـاری ڕەت دەکاتـەوە، تـا کاتێـك خەبـەری دەبێتـەوە دەبینێـت تەمـەنی لاوی تێپەڕانـدووە و بـووە بـە قـەیرە کـچ، ئـەوکات پەشـیمان دەبێتـەوە و خۆزگـە دەخوازێـت شـووی کردبایە بەو داواکارانـەی هاتبوون بۆی، بۆیـە چاوەڕوان دەکات ئینجارەیان داخوازی بەم شێوەی بۆ بێت، بەڵام چونکە تەمـەنی گەورە بووە وەکو پێشتر کوڕی لاو نایەنە داوای، بەڵکو بەتەمەن دێنە داوای، ئەویش دەڵێت من شووم بەو گەنجە جوانانـە نـەکرد چۆن شوو بەو بەرماوانە دەکەم، جا هەر دەبێت خۆزگەی پێشوی بخوازێت، بەڵام دوای چی دوای ئەوەی تەمەنی لاوی تێپەڕی.

دکتۆر (رامز طه) کە (استشاري الطب النفسي)ە دەڵێـت: ئامۆژگـاری هـەموو ئافرەتـان دەکـەم بـا هاوسـەری



ژیانیان تەنها لەسەر بنچینەی دەوڵەمەندی هەڵنەبژێرن، با عەقڵی خۆیان بە کار بێنن بزانن کێ هەڵدەبژێرن.

بەڕاستی مامۆستا هێواشیش جوانی ووتوە کە دەڵێت:

بە جارێ بەر چاوی گرتووی کۆشك و تەلار و قەمەرە

بیر و هۆشی تۆ بەردەوام هەر لەسەر زێڕ و گەوهەرە

هەر لە ملوانکە و بازنڕا تا گوڵ و گوارە و گۆبەرە

دەتەوێ هەر ئاغاژن بی، حەزت لە غولام و نۆکەرە

پێت عەیب و شوورەییە شووبکەی بەوەی لات و قەلەندە

بەڵکو هاوسەری ژیانی تۆ سەرمایەدار و بەگلەرە

بەڵام ئەی خوشکی خۆشەویست کەی ئەوە جێگای هونەرە

هەستە بگەڕێوە لای خودا هەردوو دونیات مسۆگەرە (٣)

3 - لە نووسینی: م: هێواش.

**لـــە زاری خۆیانەوە**: ئەوە بەسەرهاتی کچێکە کە کچێکی بە شەڕەف و داوێن پاکە، باوکیشی بە هامان شێوە پیاوێکی زۆر باش بووە، ئەو کچە گەنجێکی خاوەن دین و ڕەوشت هاتە داوای دوای تاوتوێ کردنی قسە ڕێك کەوتن و کچەکەی مارەبڕی، بەلاّم ئـەوەی جێـی داخـە دایکـی کـچەکەبوو، دایکـی ئـەو کـچە وەکـو زۆرێك لـە دایکـان لـە باتی ئـەوەی بەختـەوەری کچەکەی بوێت و شـتی باشــی فێـر بکـات کەچـی دەیــەوێت مـاڵی لێ تێـك بـدات سەرگەردانی بکات، بەڵێ ئەو دایکە لە هـەموو شـتێکی ئـەو کوڕە تەدەخولی دەکرد و کوڕەکـەش لەبـەر خـاتری کـچەکەی کـە مـارەی بڕی بوو ئارامی دەگرت، ئەوەبوو ئەو کوڕە لەسـەر داوای دایکـی کـچە خـۆی قـەرزدار کـردەوە بـەوەی مـاڵێکی زۆری کـڕی، ئـەم جارەیان دایکی کچە هاتە سەر ئەوەی دەبێت حەفلەکەی لە فلان نادی بێت و فلان گۆرانی بێژیش بێت، لـەو خاڵەیانـدا کوڕەکـە و دایکی کچەکە ڕێك نەکەوتن، کوڕەکە

وروتــی: من بە هیچ شێوەیەك ئەو گۆرانی بێژە ناهێنم چونکە دەزانم گوناهبار دەبم، پاشانیش خۆ من تـۆم مارە نـەبڕیوە تـاکو تۆ لەباتی کچەکەت داوا بکەی.

بــەڵێ: کوڕەکــە ڕازی نــەبوو بــەو بڕیارەیــان، بــەلاّم دایکــی کـچەکە هـەر لەسـەر قـسەی خـۆی بـوو، بـاوکی کـچەکەش تـەنها



دیکــۆر بــوو و هیــچی تــر، کــچەکە ســەری ســوڕمابوو لــەو داواکاریانەی دایکی، کوڕەکە زۆر هەوڵی لەگەڵ دایکی کچەکەدا و چەندین خێر خوازی دەنارت تاکو کارەکەی بۆ ئاسان بکەن، بــەلأم بــێ هــودە بــوو، دوای هەوڵــدانێکی زۆر کوڕەکــە هــیچ ڕێگایــەکی لەبــەر دەســتدا نــەما تــەنها جیابونــەوە لــەو کــچە، پاشانیش کوڕەکە کچێکی تری خواست خوای گەورە منداڵیشی پێ بەخشین و بە ژیانێکی بەختەوە دەژیا.

کچەکەش لە ماڵی دایکی ماوە تاکو تەمەنی بوو بە (٣٤) ساڵ، کەسیش نە دەهاتە داخوازی یەکەم لەبەر ئەوەی تەمەنی گەورە بوو، دووەم لەبەر ئەوەی تەلاق درابوو.

**دووەم: درێژەدان بە خوێنـــدن:**

یـەکێکی تـر لـەو هۆکارانـەی کـە ئـافرەت پێـی دووچـاری قـەیرەی دەبێتـەوە، ئەوەیـە کاتێـك کوڕێـك دێتـە داوای کـچێك، کــچەکە بــە بیــانوی ئــەوەی دەخوێنێــت داوای کوڕەکــە ڕەت دەکاتەوە، نەوەکا لە خوێندن دابڕێت، بەڵام ئەوە هەڵەیە چونکە شــووکردن ڕێگــای خوێنــدن ناگرێــت.. بــەڵکو زۆر جــاریش پیاوەکەی دەبێتە پاڵ پشت بۆی..

کـەوابوو خوشـکم کاتێـك کەسێك دێتـە داوات لـە کاتێکـدا ڕێگرنیـە بـۆ تـەواکردنی خوێندنەکـەت تـۆ بـۆ داواکـەی ڕەت دەکەیەوە!!

**سایتی خوشکان هەڵسا بە ڕاپرسیێک بەم شێوەی خوارەوە:**

**یەکێك لە هۆکارەکانی قەیرەیی کچان شوو نەکردنە تا خوێندن تەواو دەکرێت، ڕات چییە؟**




**ئەگەر حەز دەکەی لە ئەنتەرنێت ئەو ڕاپرسە ببینی ئەوەش لینکی سایتەکەیە:**

http://www.khoshkan.com/raprsy/raprsy04.php

أ **لــــه زاری خۆیانەوە:** من ئافرەتێکم تەمەنم (٢٧) ساڵە لە منداڵییەوە تاکو ئێستاش لە ماڵی باوکم دەژیم..

ئەو ئافرەتانەی لە تەمەنی من دان زۆر بەیان بە کامەرانی لە ماڵی پیاوی خۆیان دەژین، بەڕاستی دەردی دڵی من زۆر گرانە، هەر چەند بنووسم نا توانم باس لەو دڵ تەنگیەی خۆم بکەم..

بەڕێزان من یەکێك بووم لەو قوتابیە زیرەکانەی کە لە هەموو قۆناغەکانم و لە هەموو وانەکانم نمرەم زۆر باش بوو..

جا کاتێك گەیشتمە قۆناغی دووی ناوەندی، زۆر بابەتی (علم النفس) دەروون ناسیم پێ خۆش بوو، بە جۆرێك خەونم بەوەوە دەبینی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ببم بە پزیشکی دەروونی..

لەو ماوەیەدا کوڕە مامەکەم هاتە خوازبێنیم، بەلاّم من داواکەیم ڕەت کردەوە، چونکە من دەمویست ببم بە پزیشکی دەروونی..

ئەوەبوو کاتێك گەیشتمە زانکۆ پێیان گووتم تۆ نابیە پزیشکی دەروونی، بەڵکو دەبیت بە شارەزا لە دەروونناسی، ئەو دووانەش جیاوازیان هەیە، پرسیم بۆچی؟

وتیان پزیشکی دەروونی لە دەرەوەی وڵات دەخوێندرێت، ئەوەش بۆ من نەدەکرا، منیش بە نادڵی ملی ئەو خوێندنەم گرت، لەو ماوەیەدا سەیری زنجیرە تەلەفیزیۆنیەکەم دەکرد، کە

ئافرەتێك بوو پزیشکی دەروونی بوو، چارەسەری خەڵکی دەکرد و یارمەتیانی دەدا و ئێش وئازارەکانی کەم دەکردنەوە و خەندەی دەخستە سەر لێوی خەڵکی.. منیش بیرم دەکردەوە کە من ڕێك وەکو ئەو ئافرەتە وام یارمەتی ئەوانەی دەوروبەرم دەدەم کە تووشی کێشەی دەروونی بوونە،کەچی خۆم لە ناخمەوە کێشە دەروونیم هەیە.

ئەوەبوو کوڕە مامەکەم ژنی هێنا من لە خەیاڵی خۆمدا وامدەزانی چاوەڕوانم دەکات، ئەو هەواڵە منی تەزاند، بۆم گەڕایەوە پێی گوتبووم کە من مەغروورم بە زانستەکەم ڕاستیش دەکات، دوای ئەوەی زانکوم تەواو کرد، هیچ کارێم چەنگ نەکەوت، تەنها یەك دەزگا نەبێت کە لێی دامەزرام، بەبێ تاقەتی بەیانیان دەڕۆیشتم ونیوەڕۆش دەهاتمەوە..

بەڵی: خەونەکەم نەهاتە دی.. تەمەنیشم زۆر زوو دەڕوات.. منیش لە ماڵی باوکم دانیشتووم و چاوەڕوان دەکەم خوا دەرگای خێرم لێ بکاتەوە.. کوڕە مامەکەم پێنج کوڕ و کچێکی هەیە ماڵیشیان جیرانی ئێمەیە.. جا لە هەمووشی ناخۆشتر ئەوەیە هەر کاتێك دەیبینم لەگەڵ خێزان ومنداڵەکانی زۆر ئازار دەخۆم.. بەڵام خودا سەرفرازی بکات.

**لـــــە زاری خۆیانـــەوە**: برادەرێك دەیگوت: چوومە داوای کچێکی قوتابی زانکۆ، کە لە قۆناغی دووەم دەیخوێند، کچەکە داواکەی منی ڕەت کردەوە، کەچی من پەیمانیشم پێدا کە ڕێگر نابم لە خوێندنەکەی، بەڵکو یارمەتیشی دەدەم، بەڵام ئەو بە بیانوی ئەوەی کە شوو بکات خوێندنی پێ تەواو ناکرێت داواکەمی ڕەت کردەوە، ئەوەبوو کچێکی ترم خواست و ژیانێکی بەختەوەرم پێك هێناو خوا کۆرپەیەکیشی پێدام..

بەڵام کچەکە خوێندنی تەواوکرد و لە ماڵی دایکیەتی چاوەڕوانی شووکردن دەکات، بەڵام ئەو هەرگیز کەسێکی وەکو منی دەست ناکەوێت، چونکە من لە هەموو بوارێکدا لەسەروی ئەو بووم، کەچی ڕەتی کردەوە.. ئەو تاکو ئێستاش هەر ماوەتەوە.

**لـــــە زاری خۆیانـــەوە**: ئەو کچە قەیرەیەش بە ئاخ هەڵکێشانەوە باسی خۆی دەکات و دەڵێت: من کاتێك تەمەنم لە (١٥)ـە ساڵیدا بوو زۆر داخوازیی باشم بۆ دەهات، بەڵام من ڕەتم دەکردەوە بە بیانوی ئەوەی دەمەوێت ببم بە پزیشك..

بەڵێ: ئەوەبوو لە زانکۆی پزیشکی وەرگیرام تا ئەوکاتیش هەر بەردەوام داخوازیم دەهات، بەڵام من ڕەتم دەکردەوە بە بیانوی ئەوەی دەمەوێت خوێندن تەواو بکەم و سەدریەی سپی

لەبەر بکەم ئینجا شوو دەکەم، جا کاتێك خوێندنم تەواو کرد تەمەنم بوو بە(٣٠)ساڵ، ئەوکات ئەوانەی دەهاتنە داوام ئەو کەسانە بوون کە ژنیان هەبوو منیش ڕەتم دەکردەوە

دەمگوت: دوای ئەو هەموو ماندوبوونە شوو بە کەسێك بکەم کە ژنی هەبێت!!

هەرگیز شتی وانابێت، من چۆن شوو سەر بە هەوێ دەکەم کە خاوەنی بڕوانامە و سەروەت و سامان و پلەوپایەم!! بەڵێ ئەوبوو ئەو ئافرەتە تەمەنی بوو بە (٤٠) ساڵ ئەوکاتی دەیگووت: شوو دەکەم ئەگەر بە نیو پیاویش بێت.

**لە زاری خۆیانەوە**: ئەو دکتۆرەش تەمەنی بووە بە (٣٠) ساڵ پڕ بە دڵ هاوار دەکات و دەڵێت:

خذوا شهاداتي وأعطوني زوجا واسمعوني كلمة.. ما.. ما..

واتە: هەموو بڕوانامەکانم ببەن بۆ خۆتان، تەنها بمکەن بە خاوەن مێردی خۆم و منداڵم هەبێت و گوێم لێی بێت پێم بڵێت: دایا.. دایا..

ئەوە قسەی کچێکە لە یەکێك لە ڕۆژنامەکان نووسیویەتی و دەڵێت: هەموو بە یانیەك سەعات حەوتی بەیانی ئاخی مردن

هەڵدەکێشم، فرمێسکەکانم بە مەتمدا جۆگەلە دەگرن، ئەزانن بۆ؟!

چونکەکاتێك دەچمە عیادەکەم، لە ڕاستیدا گۆڕستان و زندانی منە، دەبینم ئافرەتەکان بە خۆیان و منداڵەکانیان چاوەڕوانم دەکەن، کەچی ئەوان سەیری ئەو سەدریە سپیەی بەرم دەکەن حەسوودیم پێ دەبەن، بەڵام ئەوە بۆچونی ئەوانە، بەڵام نازانن ئەو سەدریە سپیە لە لای من وەکو پۆشاکی ئاسنگرە وایە.

**سێیەم: گەڕان بەدوای پلە وپایە:**

یەکێکی تر لەو هۆکارانەی کە ئافرەت پێی دووچاری قەیرەی دەبێتەوە، گەڕانە بەدوای کەسێکی خاوەن پلە وپایە، ئەم جۆرەیان کەمە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئافرەتی وا هەیە کە چاوەڕوانی ئەوە دەکات، یان ماڵی باوکی داوای ئەوە دەکەن.

## چوارەم: کێشـــــــەی دەروونی:

یـەکێکی تـر لـەو هۆکارانـەی کـە ئـافرەت پێـی دووچـاری قـەیرەی دەبێتـەوە، کێـشەی دەروونییـە کـە لـەلای ئـەو کـچە درووست دەبێت، هەر ئەو کێشانە وایان لێ دەکات دوا بکەون لە شووکردن، جا ئەو کێشە دەروونیانەی بۆ کچان سەر هەڵدەدەن زۆرن لەوانە:

☆ **قسەی پڕ و پوچی خەڵکی:**

یەکێك لەو کێشـــە دەروونیانەی کە کچان دووچاری دەبن، قسەی پڕ و پوچی خەڵکیە، کە دەیترسێنن لە شووکردن بە سەدان شتی پڕ و پوچ و دوور لە ڕاستی.

☆ **حەســـــوودی:**

زۆر ئافرەت هەیە حەسوودی پێدێ فلانە کچ شوو بکات بۆیە بە هەموو شێوەیەك هەوڵدەدات بیترسێنێت لە شوو کردن.

☆ **ڕق لێبوونەوەی پیاو:**

زۆر کچیش هەیە وایان حاڵی کردووە کە پیاو ستەمکارە و شەیتانە و ڕحمی نیە، بۆیە ئەو کچەش دەترسێ و بڕوا دەکات وادەزانێت بەڕاسی هەموو پیاوێك وایە.

☆ **باوك وبرای خراپ**:

زۆرکچیش دەبینن باوکی لەگەڵیان خراپە و ئەزیەتی دایکیان دەدات، یان برایان لەگەڵیان خراپە، جا ئەوانیش وا دەزانن هەموو پیاوێك وا خراپە بۆیە لە شووکردن دەترسێن.

☆ **ترسان لە تەلاق**: زۆرێکیش لە کچان دەبینن ڕێژەیەکی بەرچاو لە ئافرەتان تەلاق دەدرێن، بۆیە ئەوانیش دەترسێن لە شووکردن نەوەکا ئەوانیش تووشی ئەو کارەساتەبن.

(د. احمد النجار) کە یەکێکە لە زانایە جیهانیەکانی شارەزا لە بواری دەروونزانی کۆمەڵایەتی

دەڵێت: ترسی تەلاق کاریگەریەکی زۆری هەیە لەسەر دەروونی کچان، کە دوا بکەون لە شووکردن، چونکە کچەکە دەترسێت نەوەکا شوو بەکەسێك بکات، ئەو کەسەش ئەوە دەرنەچێت کە ئەو لە خەیاڵی خۆیدا نەخشەی بۆ کێشابوو.

**لـــە زاری خۆیانەوە**: ئەو کچەش کە کچێکی زۆر شۆخ و شەنگ بوو، ئێستاش بووە بە قەیــرە

دەڵێت: من خۆم بە قەیرە نازانم، ئەگەرچی ماڵەوەمان زۆر نیگەرانن بۆ من، چونکە دەڵێن دواکەوتووی لە شووکردن.. جا کاتێك پێم گوت: بۆ ئاوا بێ ئومێدی لە شووکردن، ئەو زۆر بە ڕاشکاوی گوتی: ژیانی فاشلی خوشکەکانم وام لێ دەکات بێ ئومێدبم لە شووکردن.. چونکە من سێ تەجروبەم لە پێش خۆم بینیوە.. کە یەکیان بەسە بۆ ئەوەی لە شووکردن بترسم.. ئەوە حاڵی خوشکە گەورەکەمە کە شووی بە کوڕە مامی خۆم کرد، بــەڵام کوڕەمامەکـــەم هەرچـــی ئیهانـــە و خراپەیـــەك هـــەبوو لەبەرانبەری دەیکرد و لێی دەدا، چونکە پیاوەکەی خوشکم تاکو درەنگـانی شـەو نەدەهاتـەوە و لـە ڕابـواردن دابـوو، جـا کاتێـك خوشکەکەم پێی دەگوت زوو وەرەوە بۆ ماڵ و ئاگات لە من و منداڵەکان نەماوە ئەوە لەگەڵ خوشکەکەم دەیکردە شەڕ و هەرا، جا خوشکەکەشم زانی بێ سوودە لەگەڵ ئەو پیاوەدا بۆیە بەبێ دەنگی لە جەهەنەمی ماڵی پیاوەکەی ئارامی دەگرت.. کەوابوو ئەوە بەسە بۆ من تاکو شوو نەکەم و لە شووکردن بترسم.

**پێنجەم: داواکـــــاری زۆر:**

یـەکێکی تـر لـەو هۆکارانـەی کـە ئـافرەت پێـی دووچـاری قـەیرەی دەبێـت، داواکـاری زۆرە لـە کوڕەکـە، جـا یـان کـچەکە داواکـاری زۆر دەکـات یـان مـاڵی کـچە، وەکـو ئـەوەی دەبێـت خاوەنی خانی بێت یان کارمەند بێت یان مارەیەکی زۆر بدات، کەوا دەزانن ئەگەر مارەیی زۆر بێت یان داواکاری زۆر بکەن ئەوە کچەکەیان بە ڕێز دەبێت لای کوڕەکە و بەختەوەر دەبێت، بەڵام ئـەوە بۆچـونێکی هەڵەیـە، چـونکە کەسێك دینـی نـەبێ و ڕێـزی ئافرەتی لا نـەبێت ئـەوە بە فەردەیەك دۆلار کچەکەتی بدەیە هەر ڕێزی لای نابێت و ڕێزی ناگرێت، بەڵام کەسێکیش خاوەنی دین بێت ئەوە ئەو کچەی دەیخوازێت چەند داواکاری و مارەیی کەم بێت ئەوەندە زیاتر لای بەڕێز تر دەبێت و زیاتر خۆشی دەوێت، چـونکە هـەموو کەسـێك توانـای ئـەوەی نیـە ئـەو داواکاریانـە جێبـەجێ بکـات، هـەر بۆیـە ئافرەتەکـە دەمینێتـەوە و دووچـاری قەیرەی دەبێت.

🕴 <u>لـــە زاری خۆیانەوە</u>: شێخ (محمد حسان) لە وتارێکیدا دەیگوت: کچێك چەندین جار داخوازی دەهات، بەڵام باوکی داواکارییەکی زۆری دەکرد هەر بۆیە ئەوانەی دەهاتن بۆ داوای ئەو کچە دەڕۆیشتن، تاکو چەندین داخوازی بەم شێوەیە ڕەت دەکراوە، تا وای لێهات کچەکە بوو بە قەیرە بۆیە هەموو جار

دووعای لە باوك و دایكی دەكرت

دەیگوت: خودایە چۆن منیان لە شووكردن مەحرۆم كرد.. خودایە تۆش ئاوا لە ڕەحمی خۆت مەحرۆمیان بكە.

**لە زاری خۆیانەوە:** بەسەرهاتی ئەو ئافرەتەش كە لە داخا سەری نایەوە زۆر نیگەرانی كردم، ئەو كچە داماوە دایكی بە هەوەستی خۆی گاڵتەی بە دوا ڕۆژی كچەكەی دەكرد، ئەو كچە هەر داخوازیەكی بهاتبایە دایكی مەرجی وای دادەنا كە شێتیش قبوڵی نەكات، ئەوەشی بۆیە دەكرد چونكە كچەكەی لە خۆی جوانتر بوو دایكەكە ئەوەی پێ ناخۆشبوو كچەكەی لەو جوانتر بێت، بیری چووبوو ئەوە كچیەتی.

ئەو كچە جوانە دەرچووی زانكۆ بوو و داشمەزابوو.. چەندین كوڕی گەنج دەهاتنە داوای، بەڵام ئەو دایكە دڵ ڕەق و نەفامە بە بیانوی پڕ و پووچ ڕەتی دەكردنەوە.

ئەوەبوو ئەو كچە داماوە وەفاتی كرد و بە ئاواتی خۆی نەگەیشت، ئەوكاتە دایكە ستەمكارەكەی پەشیمان بۆوە لەو كارانەی دژ بە كچەكەی ئەنجامی دابوو و فرمێسكی پەشیمانی دەڕێشت.. بەڵام دوای چی!! تازە پەشیمانبوونەوە داد نادات.

## شەشەم: بێ ڕەحمی باوك و دایك و سوودمەند بوون لە کچەکەیان:

زۆرێکیش لە دایك و باوکان، کە دەبینن کچەکەیان سوودی هەیە بۆ ئەوان، وەك ئەوەی کچەکەیان موچەی هەیە، یان لە ماڵەوە کاریان بۆ دەکات.. یان.. یان.. هتد، ئەوکات ئەو دایك و باوکە لەبەر بەرژەوەندی خۆیان هەر داوایەك دێت بۆ کچەکەیان بە چەندین بیانوی دوور لە ڕاستی داواکان ڕەت دەکەنەوە.

جا بە هۆی بێ ڕەحمی باوك و دایك ئەو کچە بێ بەش دەبێ لە شووکردن تا وای لێدێ تەمەنی گەورە دەبێت و ئەوکاتیش کەس نایەتە داوای.

**لە زاری خۆیانەوە**: ڕووداوێکی سەیر کە لە دادگای (دبی) ڕوویدابوو، ئەویش ئەوەبوو کچێك کە پزیشك بوو داوای پێشکەش بە دادگا کردوو داوای دەکرد مارەبکرێت لە کوڕێك کە هاتۆتە داوای، چونکە باوکی ڕێگرە لە شووکردنی لەبەر ئەو موچەی وەری دەگرێت.. ئەو کچە داماوە

دەیگوت: چەندین کەسی چاك هاتۆتە داوای کەچی باوکی بەبێ هیچ بیانویەك ڕەتی کردۆتەوە تاکو ئەوەی تەمەنی



گەیشتۆتە (٤٠)ساڵی..

بەڵام پاشان کوڕێك هاتۆتە داوای کچەکەش سوربووە لەسەر ئەوەی حەتمەن شووی پێ دەکات، هەر بۆیە لەلایەن باوکیەوە سزایەکی توند دراوە، بە جۆرێك خەریك بووە گیانی لە دەست بدات، کە (٩) ڕۆژ لە جێگا کەتووە، چونکە باوکی دەرزی ڤایرۆساوی لێ دەدا، لەگەڵ ئەوەشدا کچەکە هەر سوور بووە لەسەر بڕیارەکەی خۆی، بۆیە کە دەرفەتی بۆ ڕێك کەوتووە هەڵاتووە و ئەو داوایەی لەسەر باوکی نووسیوە، دادگاش لە کوڕەکە مارەی بڕی و مانگانە بڕە پارەیەکیشی لەلایەن کچەکەوە بڕیەوە بۆ باوکی.

لە زاری خۆیانەوە: مامۆستایەك دەیگێڕایەوە دەیگووت: کچێکی داماو هەبوو چەندین داخوازی دەهات لە هەموو لایەك، بەڵام باوکە بێ ڕەحمەکەی هەموو داواکاریەکانی ڕەت دەکردەوە.. تاکو ئەوەی کچەکە تەمەنی بوو بە (٤٠) ساڵ هەر شووی نەکردبوو.. ئەو کچە داماوە بەردەوام خەفەت و بێ زاری لە ڕووخساری دەباری.. بە جۆرێك کە زۆر خەفەتی دەخوارت.. هەر بۆیە بەو هۆیەوە نەخۆشیەکی توند دەگرێت دەیبەنە نەخۆشخانە.. لەوێ حاڵی زۆر شڕ دەبێت.. بۆیە باوکی

دێت سەردانی بکات بزانێت کچەکە حاڵی چۆنە، کچەکە کە چاوی بە باوکی دەکەوێت

دەڵێت: بابە لێم نزیك بەرەوە با قسەیەکت پێ بڵێم.. باوکیشی لێی نزیك دەبێتەوە کچەکە بە باوکی

دەڵێت: بڵێ آمیـــن..

باوکیشی دەڵێت: آمین..

دەڵێت: بڵێ آمیـــن..

باوکیشی دەڵێت: آمین..

دەڵێت: بڵێ آمیـــن..

باوکیشی دەڵێت: آمین..

ئینجا کچەکە بە باوکی

دەڵێت: خودا لە بەهەشتی بەرینی خۆی بێ بەشت بکات باوکە، هەر وەك چۆن منت بێ بەش کرد لە شووکردن و ژیانی دنیا.. دواتر کچەکە وەفات دەکات.

## حەوتــــەم: بازرگـــانی کـــردن بـــە ئافرەتانـــەوە:

هۆکارێکی تر کە ئافرەتان دووچاری قەیرەیی دەکاتەوە، ئەو کەسانەن کە لە ژێر چەندین ناو و ناتۆرە بازرگانی بە ئافرەتانەوە دەکەن، کە بە ناوی چەندین ڕیخراو و ناوی بریقەدار گوایا داکۆکی لە مافی ئافرەت دەکەن و مافی ئافرەت دەسێننەوە..

بەڵێ: زۆربەی ئەو ڕێخراوانەی بە ناوی داکۆکی کردن لە مافی ئافرەتانەوە دامەزراون، لە ڕاستیدا بۆ بازرگانی کردن بە ئافرەتانەوە دامەزراون و بۆ وێران کردنی ئافرەتان دامەزراون، بەوەی ڕەخنە لە ئایەتی قورئان دەگرن

دەڵێن قورئان ستەمی لە ئافرەت کردووە بەوەی جائیزی کردووە پیاو لە ژنێك زیاتر بهێنێ، بەوەش ڕێگر دەبن بۆ چارەی قەیرەیی، بەڵام چونکە ئەوانە مەبەستیان تەنها بازرگانی کردنە بە ئافرەتانەوە بۆیە خۆشیان گاڵتەیان بە قسەی خۆیان دێت و بۆ بەرژەوەندی خۆیان عەمەل بە قسەی خۆیان ناکەن، نموونەش زۆرە لەو بارەوە کە ئەم ڕاستیە بسەلمێنێ، لەوانە:

(ب-ن) ئافرەتێك بوو سەرنووسەری ڕۆژنامەی (...) بوو، کە گوایە بەردەوام داکۆکی لە مافی ئافرەتان دەکات، بەوەی ئافرەت

لەلایەن پیاوەوە ستەمی لێ کراو، لەبەر ئەوەی سەر بە هەوێ دەدرێت، کەچی بۆ خۆی سەر بە هەوێ شووی بە پیاوێك کرد کە ژنێکی تری هەبوو، جا کاتێك لێیان پرسی ئایا ڕاستە شووت بە پیاوێکی خاوەن ژن کردووە؟ لە وەڵامدا

گووتی: بەڵێ من وەك هەموو ئینسانێك پێویستم بە ژیانی تایبەتی خۆم هەیە و شووم کردووە.

دیارە تەنها خانم پێویستی بە ژیانی تایبەت هەیە و خەڵکی تر پێویستی بە ژیان نیە و با شوو نەکەن.

ئافرەتێکی تر کە لە یەکێك لە ڕێخراوەکانی ژنان بوو شووی بە پیاوێك کرد کە (٩) منداڵیشی هەبوو. (سایتی: کوردستانیوز).

ئافرەتێکی تر گوایە زۆر داکۆکی لە مافی ئافرەتان دەکات، کەچی دواتر بۆ خۆی شووی بە پیاوێك کرد کە پیاوەکە دوو ژنی تری هەبوو.

بەڵێ: ئەوانە مەبەستیان بەرژەوەنی خۆیانە و هیچی تر، زۆرێك لەو ڕێخراوانەش هانی ئافرەتان دەدەن تاکو لەماڵەوە لەگەڵ پیاوەکانیان یان باوکیان یان براکانیان بە شەڕ بێن و دواتر ماڵ بە جێ بهێڵن و ڕوو بکەنە ئەوان، ئەوانیش بۆ مەرامی خۆیان بە کاری بهێنن، بۆ نموونە (م/خ-د) شوێنێك بوو گوایە

پەناگەی ئەو ئافرەتانەیە کە لەماڵی خۆیان هەڵدێن و ئەوان داکۆکی لە مافەکانیان دەکەن، دواتر دەرکەوت ئەو شوێنە بۆتە بنکەیەکی بێ ڕەوشتی بۆ ئەو ئافرەتانەی لەوێن کە کاری بێ ڕەوشتیان لەگەڵدا دەکرێت.

جا بە کورتی زۆرێك لەوانەی بە ناو داکۆکی لە مافی ئافرەت دەکەن لە ڕاستیدا خۆیان مافی ئافرەتان پێشێك دەکەن، چونکە کچێك ئەگەر شووبکات ولەگەڵ پیاوەکەی باش بێت دەڵێن ئەوە لەلایەن پیاوەکەیەوە مافی پێشێل کراوە بە چەندین قسەی سەر قۆزی بن ئاڵۆز ماڵ لە ئافرەت تێك دەدەن، یان بە ناوی ئازادی یەوە وا لە ئافرەتان دەکەن کاری وا بکەن کە لەگەڵ کۆمەڵگای ئێمە ناگونجێ دواتر ئەو ئافرەتانە تووشی کێشە دێن لەگەڵ خێزانەکانیان یان دەکوژرێن، یان ئافرەتێك دەیەوێت شوو بە پیاوێکی خاوەن ژن بکات ڕێگای لێ دەگرن و ناهێڵن و دەڵێن مافی پێشێل کراوە، تا وای لێ دێ ئەو ئافرەتە دووچاری قەیرەیی دەبێتەوە، بەلاْم بۆ خۆیان دروستە سەر بەهەوێ شوو بکەن.

ئەو قسەی ئەوان ئەو ڕوداوەم بیر دەخاتەوە کە (السيد حسين الموسوی[٤]) لە کتێبەکەی خۆی بە ناوی (للـــه ثم للتاريخ)

**دەڵێت**: جارێکیان لە نووسینگەکەی ئیمام (الخوئی) دانیشتبووم دوو گەنج هاتن پرسیاریان هەبوو، دیاربوو ئەو دوو گەنجە یەکیان سونی بو یەکیان شیعی بو لە بارەی (متعة)وە کێشەیان بۆ دروست ببوو، یەك لە گەنجەگان پرسیاری کرد گوتی ئایا (متعة) حەرامە یان حەلاڵە؟

ئیمام (الخوئی) زۆر بە سەیری بۆ گەنجەکەی ڕوانی وەك بڵێی پرسیارەکەی ئەو گەنجەی پێ سەیر بێت، پاشان پێی گووت: تۆ خەڵکی کوێی؟

گەنجەکە گوتی: من خەڵکی (موصل)م بەڵام ئەوە دوو مانگ دەبێت لێرە کار دەکەم، واتە (النجف).

(الخوئی) پێی گوت: کەوابوو تۆ سونی؟

گەنجەکە گوتی: بەڵێ من سونیم.

(الخوئی) گوتی: کاکە (متعة) لەلای ئێمە حەلاڵە و لەلای ئێوە حەرامە.

---

(4) السيد حسين الموسوی: یەکێك بوو لە زانا ناو دارەکانی شیعە بەڵام دواتر وازی لە مەزهەبی شیعە هێناو بوو بە سونە،ئینجا کتێبێکی دانا لەسەر پۆخڵەواتی شیعە بەناوی (للـــه ثم للتاريخ).

گەنجەكە گوتى: باشە مادام لاى ئێوە حەلاڵە، من تاكو چەند مانگى تر لێرە دەمينێمەوە، تۆش ئەو چاكەم لەگەڵدا بكەكچەكەى خۆتم بدەرێ بە (متعة) تاكو دەچمەوە بۆ خاكى خۆم پاشان بۆت دەگەڕێنمەوە.

(الخوئى)كەمێك داما ئينجا گوتى: كاكە (متعة) حەرامە لەگەڵ كچى ئێمە بكرێت، چونكە ئێمە مامۆستا و گەورەين، بەلاّم (متعة) دروستە لەگەڵ خەڵكى عەمەى ترى شيعە بكرێت.

گەنجە شيعيەكە كە گوێى لەو قسەى (الخوئى)بوو وەكو بركان تەقيەوە **گوتى**: ئەى زاڵمينە بۆ خۆتان (متعة) حەلاڵ دەكەن كە لەگەڵ خوشك و دايكى ئێمەدا بيكەن دەڵێن خێرتان دەگاتێ پێى لە خوا نزيك دەبنەوە، بەلاّم بۆ ئێمە نابێت (متعة) لەگەڵ كچى ئێوە بكەين.

**<u>لە زارى خۆيانەوە</u>: ڕووداو گەلێك زۆرە لە بارەى ئەو كەسانەى گوايە داكۆكى لە مافى ئافرەت دەكەن، كەچى وايان لە ئافرەتان كردووە ژيانيان لێ تاڵ بێت، جا ئەگەر بێت و لەسەرى بنووسم دەبێت كتێبێكى گەورەى بۆ تەرخان بكەم، بەلاّم من نامەوێت كتێبەكە درێژە بكێشێ، بۆ زياتر بڕوانە كتێبى (ڕاستيكى ونبوو!) كە لەوێ هەموو فلێڵ وخيانەتەكانيانم ڕوون كردۆتەوە.**

## هه‌شته‌م: به‌رچاو نه‌بوونی کچـــــــه:

ئافره‌ت تاڕاده‌یه‌کی زۆر جوانیه‌که‌ی ده‌وری هه‌یه، به‌ تایبه‌ت لای ئه‌وکه‌سانه‌ی، ته‌نها چاویان له‌ جوانی ئافره‌ته‌ و هیچی تر، ئینجا هه‌ندێ له‌ کچان هه‌ن به‌رچاونین، جا یا ئه‌وه‌تا جوان نین یان سوتاون یان سکماك شێواوێکیان پێوه‌ دیاره‌ یان.. یان.. هتد.

ئا ئه‌و کچانه‌ هه‌موو که‌سێك نایانیه‌وێت، مه‌گه‌ر که‌سێکی وا که‌ خه‌له‌لێکی هه‌بێت، که‌وابوو پێویسته‌ له‌سه‌ر ئه‌و ئافره‌تانه‌ به‌ خه‌یالآت نه‌ژین، به‌وه‌ی چاوه‌ڕوانی کوڕێکی وا بکه‌ن له‌ سه‌روی خۆیان بێت، به‌ڵکو ده‌بێت ئه‌وان چاوپۆشی له‌ هه‌ندێ شت بکه‌ن، به‌وه‌ی ئه‌گه‌ر یه‌کێك هاته‌ داوایان له‌ شان و شوکه‌تی ئه‌و ده‌وه‌شایه‌وه‌ با شووی پێبکات و سه‌یری به‌رز نه‌کات، چونکه‌ ئه‌گه‌ر وانه‌کات ئه‌وه‌ ده‌بێت به‌ ته‌نها سه‌ر بنێته‌وه‌ و تووشی قه‌یره‌یی ده‌بێت.

**لـــە زاری خۆیانەوە:** ئەو کچە تەمەن (٣٣) ساڵە

دەڵێت: من هەر لە منداڵیـەوە هەستم بەوە دەکرد کە جوان نیمە و ناشیرینم.. بە هەر حاڵ کاتێك خوێندنی ئامادەییم تەواو کرد، چومە زانکۆ، لە زانکۆدا خۆشەویستی کوڕێك کەوتە دڵم کە لە هەمان قۆناغ و بەشی من بوو.. ئەوینی ئەو کوڕە بەو شێوە کەوتـە دڵمْ کـە مـن بـەردەوام لـە وانـەکان ئامـادە دەبـووم، ئـەو کـوڕەش ئامـادەی وانـەکان نـەدەبوو، هـەر بۆیـە هـەموو کـات لـێم نزیـك دەبویـەوە تـاکو پوختـەی وانـەکانم لێ وەرگرێـت، منـیش ئەویندارى بووم، کەچی ئەو هیچ ئاگای لە من نەبوو، بەڵکو تەنها لەبەر وانەکان لێم نزیك دەبویەوە..

کاتێك گەیشتمە قۆناغی چوارەم ئەو خۆشەویستیە قوڵەی خـۆم بـۆی دەربـڕی، بـەڵام ئـەو هـیچ وەڵامـی نـەبوو.. جـا کـە ئیمتحانی کۆتای ساڵیشمان ئەنجامدا دەمبینـی ئـەو کوڕە خۆی لە من دەدزیەوە، منیش لێیم دووبارکردەوە کەچـی ئـەو زۆر بـە ڕاشـکاوی پێـی ووتم مـن ئـەو کـچە نـیم کـە ئـەو دەیـەوێت ئـەو ئـافرەتێکی تایبـەت مەنـدی دەوێـت، ئـەوکات تێگەیـشتم ئـەو کچێکی جوانی دەوێت..

بەڵێ: دوای دەرچوونم لـە زانکـۆ دەمبینی زۆربـەی دۆسـتە کـچەکانم شـوویان دەکـرد، تـەنها مـن مابوومـەوە، منـیش زۆر

خەفەتم دەخوارد، باوك و دایكم زۆر بۆ حاڵی من پەرێشان بوون، زۆرجار گوێبیست دەبووم لێیان باسی منیان دەكرد دەیانگوت: چونكە جوان نیە و دەوڵەمەند نیە كەس نایەتە داوای.

منیش بۆ ئەوەی خۆم لەو نەهامەتیە ڕزگار بكەم، پەنام بردە بەر ڕێگایەكی نا شەرعی بەوەی پەوەندیم لەگەڵ كوڕێك بەست.. دەشم زانی ئەو كوڕە خۆشی ناوێم تەنها مەبەستی ڕابواردنە.. تا ئەو ڕادەی لەو پەیوەندیەی نێوانمان لەگەڵ ئەو كوڕە حەڕام ڕوویدا.. من ئەوەم بە چارە دەزانی، بەڵام بە داخەوە نەك هەر چارە نەبوو، بەڵكو وێران كردنی ژیانم بوو بۆ هەتا هەتای.

## نۆیــــەم: حوکمەت و بواری بەدڕەوشتی:

هۆکارێکی تر کە کچانی کۆمەڵگاکەمان دووچاری قەیرەیی دەکاتــەوە حوکمەتــە، حوکمــەت وەك باوکێــك وایــە بەســەر ئــەو کۆمەڵە خەڵکەی لەبەر دەستی دایە، دەبێت لە خەمیاندابێت، نەك هــەموو توانــای خــۆی بخاتــە گــەڕ بــۆ خــوێن مــژینیان و دژایــەتی کردنیان، حوکمەت دەبێت بوار خۆش بکات بۆ ئەو کوڕانەی ژن دەهێنن و بۆ ئەو کچانەش کە شوو دەکەن، نەك باجیان لەسەر دابنێــت تــاکو نــەتوانن ژیــانی هاوســەری پێــك بهێــنن، حوکمــەت دەبێــت وەك بــاوك چــاودێری منداڵــەکانی بکــات نــەکا تووشــی خراپەبن، نەك ئەوەی یانەی بەد ڕەوشتیان بۆ بکاتەوە و بواری خراپــەیان بــۆ والاَ بکــات، تــاکو هــەر خــەریکی خراپــەکاری بــن و بیریــان بــە لای پێــك هێنــانی خێــزان نەچێت و هــەرگیز بیری لــێ نەکەنەوە.

**لــــــە زاری خۆیانــەوە:** ئـەو کـوڕە کـە تـەمـەنی (٤٥) سـاڵە فەرمانبەرە لە یەکێك لە دائیرە حوکحمیەکان

دەڵێـت: مـن چـۆن ژن دەهێـنم لەبـەر ئـەوەی چـۆن بمـەوێت ڕادەبوێرم، من ئێستا ژنم نەهێناوە وەك مێشەنگوینم هەر جارەی لەسەر گوڵێکم، بەوەی پەیوەندنیم لەگەڵ چەندین کچ هەیە هـەر جـارەی لەگـەڵ یـەکێکیان ڕادەبوێرم، هـەر بۆیـەش بڕوام بە هـیچ کچێك نەماوە، کەوابوو من چۆن ژن دەهێنم و خۆم بە ئافرەتێك دەبەستمەوە.

## دەیەم: بە شوودانی گەورە پاشان گچکە:

خاڵێکی تر کە کچان دووچاری قەیرەیی دەکاتەوە، بە شوودانی کچی گەورەیە ئینجا گچکە، بەڕاستی ئەوەش یەکێکە لەو داب و نەریتە ناشەرعیانەی کە کۆمەڵگای ئێمە خوی پێیەوە گرتووە، گوایە ئەگەر داوای کچی گچکە هەبوو ئەوانیش کچە بچوکەکەیان بە شوودا ئەوکات کچە گەورەکە دەمینێتەوە.. بەلاّم ئەم بۆچوونە هەڵەیە، چونکە زۆر جار بینیومانە کچی گەورە داوای نەبووە، جا کاتێك کچی بچوك بە شوودراوە کچی گەورەش داوای هاتووە.. کەوابوو پێویستە لەسەر دایکان و باوکان ئەگەر زانیان کچی گەورەیان کاتی شووکردنی هاتبوو، بەلاّم ئەو لەبەر خوێندن شووی نەدەکرد یان بە هەر هۆیەکی تر بێت وەك ئەوەی داواکاری نەیەت، لەگەڵ ئەوەشدا داواکاری کچی بچوکەکەیان دەهات ئەوە با کچی گچکە ڕانەگرن، چونکە زۆر جار وابووە کچی گچەکە بووە بە قوربانی کچی گەورە، لە کاتێکدا کچی گەورە بووە بە قەیرە ئەوانیش لەبەر گچە گەورەکە هەر داوایەك هاتبێت بۆ گچکەکە ڕەتی دەکەنەوە، هەر بۆیەش گچکەکەش دوو چاری قەیرەیی دەبێتەوە.

**لـــــە زاری خۆیانـــەوە**: مـن کـە ئێستا دووچاری قـەیرەیی بوومە، هۆیەکەشی ئەوە بوو من خۆشکێکی لە خۆم گەورە ترم هەبوو، ئەوەبوو داخوازی من هات.. داخوازیەك کە بە دڵی من بوو، بە دڵی باوکیشم بوو، بە دڵی دایکیشم بوو، بەڵکو هەموومان ئەو کوڕەمان بە دڵ بوو، ئەو کوڕە هەر ئەوە بوو کە ئێمە چاوەڕمانمان دەکرد.

بەڵام بەداخەوە باوکم داواکەی ئەو کوڕەی بە نادڵیەوە ڕەت کردەوە، لەبەر ئەوەی من کچی گچکەم کچی گەورە ماوە دەبێت ئەو لە پێش من شوو بکات.

ئەوەبوو کوڕەکە چوو کچێکی تری خواست منیش ئاوا مامەوە.. دوای ماوەیەك داخوازی خوشکە گەورەم هات و شووی کرد، ئەوەی لەو نێوانە زیانی پێ گەیشت من بووم، من بووم بە قوربانی داب ونەریتی ئەو کۆمەڵگایەمان.

**لـــــە زاری خۆیانـــەوە**: ئـەو ئافرەتـە ئەنـدازیارەش کـە تەمەنی (٣١) ساڵە دەڵێت: من تاکو ئێستا شووم نەکردوە هەر بۆیەش زۆر نیگەران و پەرێشانم، چونکە کێشەی من ئەوەیە خوشکێکم هەیە(٤) ساڵ لە من بچوك ترە، باوك و دایکیشم

دەڵـێن دەبێـت یەکـەم جـار تـۆ شـوو بکـەی ئینجـا خوشـکە بـچوکەکەت بـە شـوو دەدەیـن، منـیش زۆر پەرێـشانم بـۆ حـاڵی خوشـکە بـچوکەکەم، لەبەر ئەوەی من بووم بە ڕێگر لەبەر شـوو کردنی ئەو.

بـەڵێ مـن تەمـەنم گـەورە بـووە و کەچـی بـاوك و دایکیـشم لەسەر قسەی خۆیان سوورن کە دەبێت سەرەتا مـن شـوو بکـەم، بەڕاستی ئەو کۆمەڵگایەی ئێمە زاڵمە، چی دەبێت ئەگەر کچی گچکە پێش کچی گەورە داوای هات شوو بکات!!

## یانزەهەم: داگیرکردنی کچە لەلایەن خزمانیەوە:

خاڵێکی تر کە بە هۆیەوە کچان دووچاری قەیرەیی دەبنەوە، دەست بەسەرا گرتنی کچەیە لەلایەن خزم و کەسانیەوە، بەوەی ماڵە عمی کچە یان ماڵی خاڵی یان خزمێکی تری وەك کاڵایەك ئەو کچە داگیر دەکات، یان باوکی کچە یان براکانی تاپۆی دەکەن لەسەر خزم وکەسانی خۆیان، ئینجا هەر چەند داوای ئەو کچە دێت ئەوان ڕەتی دەکەنەوە و

دەڵێن: واللە خزمەکانمان داگیریان کردووە و دەیدەین بەوان، بەڕاستی ئەمە نەریتێکی زۆر دورە لە دین و ئینسانیەت، ئاخر ئەگەر کەسێك کەسێکی بە دڵ نەبێت تۆ چۆن زۆریان لێ دەکەی، پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: (( لا تنكح البكر حتي تستأذن قالوا: يا رسول الله وكيف إذنها ؟ قال: أن تسكت )) رواه مسلم.

واتە: کچ نابێت بە شوو بدرێت تاکو ئیزنی لێ نە خوازرێت . کە ئایا ڕازیە بەو کوڕە یان نا؟. هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا چۆن ئیزنی لێ دەخوازرێت؟ پێغەمبەر لە وەڵامدا فەرمووی: کچەکە بێ دەنگ دەبێت، . واتە: ئەگەر پرسیاریان لە کچەکە کرد کە ئایا بەو کوڕە ڕازی؟ ئەویش بێ دەنگ بوو دەکات ڕازیە.

جا لەبەر ئەوەی زۆرێك لە كوڕان حەز ناكەن ژن لە خزمی خۆیان بهێنن، بەڵام باوكیان بە زۆر ناچاریان دەكەن كە ژن لە خزمی خۆیان بهێنن، كاتێكیش كە كچەكە دەخوازێت بە دڵی خۆی نیە، ئەوكات تووشی سەدان كێشە و دەردەسەری دەبێتەوە، یان كچێك بە زۆر دەدەن بە ئامۆزای خۆی یان خزمی خۆی كەچی كچەكە لەگەڵ ئەو زەواجە نیە، جا زۆر جار هەیە كچەكە لەبەر ئەم نەریتە خراپە شوو ناكات، یان خزمەكانی پێی ڕازی نین، لەبەر هەر هۆیەك بێت، ئەوكات كچە دووچاری قەیرەیی دەبێتەوە.

**أ لـــە زاری خۆیانەوە**: (پەریسە) كچێكی شۆخ و شەنگە كاتێك لێیم پرسی بۆچی دووچاری قەیرەیی بوویت، لە وەڵامدا گوتی: پێنج ساڵ پێش ئێستا كوڕە مامەكەم هاتە خوازبێنیم، بەڵام من ڕەتم كردەوە چونكە هیچ لە مانای ژیان نازانێت، تەنها بیر و هۆشی لای پارە كۆكردنەوە و سەروەت و سامانە و هیچی تر، بەڵام كوڕە مامەكەشم سوور بوو لەسەر ئەوەی من بخوازێت، باوكیشم

دەیكوت: ئەگەر شوو بە كوڕی برام نەكەی دەبێت شوو بە گۆڕ بكەی.

هەر بۆیە منیش ووشەی شووکردنم لە ژیانی خۆم دەرهێناوە، ئەوەش بە خۆشی خۆم نیە، بەڵکو باوکم بەسەری سەپاندووم کە دووربم لە خۆشترین شت لە دنیا کە سۆزی دایکایەتیە..

ئەوە کێشەی من نیە بە تەنها بەڵکو زۆرێك لە کچان ئەوە کێشەیانە، بەڵام ناوێرن بدرکێنن، بەڕاستی باوکان هۆیەکی سەرەکین بۆ دووچار بوونی کچەکانیان بە قەیرەیی، چونکە دەڵێن: کچەکەم بۆ کوڕی برامە، کچەکەشی شوو بە کوڕی برای ناکات.

جا لێرەدا کێ دەبێت بە قوربانی؟! بێگومان کچە؟

## دوانزەهەم: چاوەڕوانی دڵدارەکەی:

هۆکارێکی تر کەوا لە کچان دەکات دووچاری قەیرەیی ببنەوە دڵـــدارییە، زۆر جار هەیە کوڕێك کچێك بە ناوی دڵداری وخۆشەویستیەوە دەخەڵەتێن و مەبەستیشی خواستنی کچەکە نیە تەنها مەبەستی ڕابواردنەوە و هیچی تر، جا کاتێك کچەکە داوای لێ دەکات بێتە خوازبێنی سەد و یەك بەهانەی بۆ دەهێنێتەوە و فریوی دەدات تاکو ئەوکاتەی خەبەری دەبێتەوە کە ئەو تەنها نێچیرێك بووە و هیچی تر، ئەوکاتیشی دەبینێت یان ناوی زڕاوە یان تەمەنی لاوی خۆی هەمووی لە چاوەڕوانی سەرف کردووە و بەرەو قەیرەیی چووە.

یان کچێك کوڕێکی خۆشدەوێت ماڵی باوکیشی ڕازی نین بیدەن بەو کوڕە، ئینجا ئەو کچە هەر داوای دێت ڕەتی دەکاتەوە، لەبەر خاتری دڵخوازەکەی، کەچی دوای چەندین جار و ساڵ کوڕە و کچە تەمەنێکی زۆر تێدەپەڕێنن، بەلاَم ماڵی باوکی هەر ڕازی نابن بیدەن بەو کوڕە بۆیە کوڕەکە بێزار دەبێت و داوای لێبوردن لە کچەکە دەکات و ژن دەهێنێ، کچەکەش دەیەوێت کوڕەکە لەبیر خۆی بباتەوە و شووبکات، کەچی دەبینێت تەمەنی گەورەبووە و هەموو کەسێك نایەوێت.

کەوابوو خوشکی بەڕێز کە زانیت ئەو کەسەی حەزدەکەی ببی بە هاوسەری بۆ تۆ نابێت لەبەر چەندین هۆ نابێت هەر لە چاوەڕوانیدابی، بەڵکو دەبێت ئاگات لە خۆت بێت تەمەنی لاویت بە فیڕۆ نەڕوات.

لــە زاری خۆیانەوە: ئەو کچە دەڵێت: من تائێستاشی لەگەڵدابێت، ناتوانم بڕوام بە پیاو هەبێت، من تا تەمەنی (٢٩) ساڵیش، قوربانیم بە ژیانی خۆمدا بۆ کوڕێ، کە زیاتر لە حەوت ساڵ یەکترمان خۆش دەویست، تا وای لێهات هەرچی دەهاتە خوازبێنیم ڕەتم دەکردەوە.. بەڵام من چوزانم دڵدارەکەم پیاوێکی بێ وەفای لێ دەردەچێت!

ئێستاش کە (٤) ساڵ بەسەر هەرس هێنانی ئەم خۆشەویستیەم تێپەڕی کردووە، تاکە شتێك کە فێری بووم باوەڕم بە پیاو نەبێت.. بە چەشنێك هەر کە باسی شووکردن دێتە گۆڕێ، بڕوام پێبکەن ڕقم لە ژیان دەبێتەوە، هەر بۆیەش هەرگیز بیری لێ ناکەمەوە، چونکە من (٧) ساڵ لە تەمەنی لاوی خۆم کردە قوربانی کوڕێك، کەچی ئەو دواتر چوو ژنی هێنا، من ئەوەندە ئەوم خۆش دەویست هەموو کەسێکم بەلاوە نابوو لەبەر خاتری ئەو، بە جۆرێك کە دایك وباوکم لە خۆم تۆراندبوو لەبەر

خاتری ئەو، بەڵام ئەو بەبێ ئەوەی من ئاگام لێ بێت، ژنی هێنابوو.

**لـــە زاری خۆیانەوە:** پیرەژنێکیان پێشاندام کە شووی نەکردبوو، دەیانگووت ئەو پیرەژنە کاتی خۆی دە پانزە ساڵ کوڕێکی خۆش دەویست، کوڕەکە چەندین جار دەهاتە داوای، بەڵام ماڵی باوکی کچە ڕەتیان دەکردەوە، بۆیە کوڕەکە بێزار بوو ژنی هێنا، ئەو پیرەژنەش تەمەنی لاوی نەمابوو، بۆیە هەر بە تەمەن دەهاتنە داوای، بەڵام ئەو چاوەڕوانی گەنجێکی دەکرد بێتە داوای، ئەوەی چاوەڕوانی دەکرد نەهاتەدی و هەر بە کچی ماوە.

## سێنزەهەم: نـــــــاو زڕان؛

خاڵێکی تر کە کچان دووچاری قەیرەیی دەکات، ناو زڕانـــە، واتە: ناوی بە خراپ چووە لەلای خەڵکی، یان ناوی خانەوادەکەی بە خراپ چووە، هەر بۆیە خەڵکی ناچنە خوازبێنی..

جا بۆیە ناوی زڕاوە یان لەبەر ئەوە بووە چونکە ئافرەتێك بوو گوێی بە کەڕامەت و سومعەی خۆی نەداوە، یان لەبەر ئەوە ناوی زڕاوە، چونکە ماڵەوەیان گوێیان بە کەڕامەت و سومعەی خۆیان نەداوە.

(د.عزة کریم) سەرۆکی یەکەی خێزانی دەڵێت:

"یەکێك لەو خاڵانەی کەوا لە گەنجان دەکات ژن نەهێنن و کچانیش دووچاری قەیرەیی ببنەوە، نەمانی متمانەیە لەلای کوڕان بەرانبەر بە کچان، نەمانی متمانەی کوڕانیش لەبەر ئەوەیە، کە دەبینێت هێندی لە کچان ڕەفتاری زۆر ناشیاو دەکەن و ڕێز لە ئازادی خۆیان ناگرن".



زۆر لە کچان هەن بۆ ئەوەی کەسێك بێتە داوایان خۆیان سوك دەکەن بەوەی تەلەفۆن بۆ خەڵکی دەکەن، یان خۆیان بە شێوەیەکی ناشیاو ڕووت دەکەنەوە و خۆیان دەڕازێننەوە و لەولا بۆ ئەولا دەڕۆن.. یان.. یان.. هتد.

ئا ئەمانە هەمووی کچان سووك دەکەن لە بری ئەوەی کوڕان بێنە داوایان، بەڵکو گاڵتەشیان پێ دەکەن و بە سووکیان دەزانن.

خوشکی بەڕێز ئاگات لە کەرامەتی خۆت بێت، چونکە ئەو کارانەی دەیکەی وادەزانی سوودت پێ دەگەیەنێت، بەڵام لە ڕاستیدا زیانت پێ دەگەیەنێت و سووکت دەکات، بزانە ئەو کوڕانەی دەیانەوێت ژنیش بهێنن، ئەگەر کوڕەکە زۆر خراپیش بێت، تۆی بۆ دەست نیشان بکەن تۆی ناوێت و دەڵێت: من ئافرەتێکی ئاوا سووك و چروکم ناوێت، بەڵکو کچێکی بە ڕەوشتم دەوێت.

کەوابوو تۆ تەنها گاڵتە بە خۆت دەکەی و بویتی بە بوکۆڵەیەك بە دەستی کەسانی نەفس نزمەوە.

## چواردەهەم: واز لە کارکـــــردن ناهێنم:

خاڵێکی تر ئەوەیە کە کچەکە کاردەکات لە دەرەوەی ماڵ، جا کارەکەی حکومی بێت یان ئەهلی، کاتێك ئەو کچە داخوازی دێت مەرج دادەنێت کە بەردەوام دەبێت لە کارەکەی، لە کاتێکدا کوڕەکە پێی دەڵێت من نامەوێت ماڵێکی ساردم هەبێت، دەمەوێت خێزانم چاودێری منداڵەکانم بێت، منیش کار دەکەم و هەموو پێداویستیەکت بۆ دابینم دەکەم، بەڵام کچەکە داخوازیەکە ڕەت دەکاتەوە بە بیانوی ئەوەی کوڕەکە گوتیەتی نامەوێت خێزانم کاربکات.

خوشکی بەڕێز هەر کەسێك کەکار دەکات بۆ ئەوەیە تاکو بژێوی ژیانی پەیدا بکات، جا کە کوڕێك هاتە داوات و بە دڵی تۆ بو، تۆش لەبەر خاتری کارەکەت ڕەتی بکەیەوە، بەڕاستی ئەوە کارێکی هەڵەت کردووە.

<u>لـــە زاری خۆیانەوە</u>: من کچێك بووم وەکو هەموو کچانی تر خەونم بەوەوە دەبینی ڕۆژێك لە ڕۆژان کوڕێك بێتە داوام وەك ئەوەی لە خەیاڵی خۆمدا نەخشاندبووم، دوای ئەوەی خوێندنم تەواو کرد، بە مامۆستا دامەزرام، لەو ماوەیەدا چەند داخوازی

یەکم هات، بەلاّم هیچی شیاوی ئەوە نەبوون ببم بە هاوسەریان.. دواتر کوڕێك هاتە داوام ڕێك ئاوابوو کە من لە خەیاڵی خۆمدا دیاریم کردبوو، بەڵکو ئەو جۆرە کوڕەی من دەمویست زۆر مواسەفاتی زیاتریشی تیابوو، ئەو کوڕە لە هەموو شتێك لە سەرەوەی من بوو.

بەڵـێ: ئەو کوڕە هاتە داخوازیم، بەلاّم داوایەکی هەبوو پێی وونم: من کەسێکم ماڵ لام زۆر گرنگە بۆیە من هەموو پێداویستیەکت بۆ دابین دەکەم، تەنها تۆ دەوام مەکە.

بەلاّم من داواکەیم ڕەت کردەوە، ووتم هەرگیز واز لە دەوام ناهێنم، بۆیە ئەویش ڕۆیی، دوای ماوەیەك زانیم ژنی هێناوە، لەگەڵ خیزانی بە بەختەوەری دەژیا دوای ماوەیەکی تر منداڵیشیان بوو، منیش هەر چاو لەڕێ بووم و هەر چاو لە ڕێم، بەبێ تاقەتی دەچمە دەوام و دێمەوە ماڵ، هەر کاتێکیش ناوی ئەو کوڕە دێنن من حاڵی دەروونیم تێك دەچێت، بەلاّم بەرۆکی کەس ناگرم، چونکە من خۆم گاڵتەم بە چارەی خۆم کرد، لەبەر کارکردن ئەو کوڕە باشەم لە دەستی خۆمدا، لە کاتێکد کارکردن بۆ بژێوی ژیانە، نەك بۆ هەڵکێشان و پیاسەکردن.

**پانزەهەم: بێ کاری و گرانـــــــی:**

هۆکارێکی تر بێ کاری گەنجەکانە، چونکە گەنج ئەگەر کارێکی نەبێت خۆی پێ بژێنێ، چۆن دەتوانێت ژن بهێنێ و ماڵ پێکەوە بنێت.

بەڵێ: گەنجێك تاکو کاتی ژن هێنانی دێت ئەوە هەر دەخوێنێ، کاتێکیش خوێندن تەواو دەکات ئەگەر دابمەزرێ، ئەوە موچەکەی بەشی خۆی ناکات، چجای ئەوەی ژنیش بهێنێت و کرێی خانوو بداو.. کری کارەبا.. کرێی ئاو.. موبایل.. نوڕماڵ.. ئەنتەرنێت.. منداڵ.. و.. و.. و.. هتد.

هەر بۆیە گەنجەکان بیر لە ژن هێنان ناکەنەوە و ڕێگای خراپ دەگرنە بەر، مەگەر گەنجانێك نەبن، کە لە خواترسن و لە ترسی خودا خۆیان دەپارێزن.

<u>**لــــە زاری خۆیانەوە:**</u> پێویست ناکات لێرەدا چیرۆك بهێنمەوە، چونکە وەك عەرەب دەڵێت:

**لســـــان الحال ابلــــــغ من المقـــال.**

واتــە: زمانی حاڵ و گوزەرانیان دەدوێن و شتەکان ڕوون دەکەنەوە، پێش ئەوەی زمانیان قسە بکات.



# چارەســــەری قەیرەیی

چەند چارەسەرەیەك هەیە بۆ قەیرەیی، لـەوانە:

**یەکەم:** دوورکەوتنەوە لەو هۆکارانەی کە پێشتر باسمان کردن، پەیڕەو نەکردنیان و خۆ لێ پاراستنیان.

**دووەم:** وەلی ئەمری کچە دەبێت خەمی کچەکەی بێت، بۆ ئەوەی کەسێکی باشی بۆ بدۆزێتەوە، کە هاوکوفی ئەو بێت، بۆیە دەبینین لە سەردەمی پێشینانی چاکمان قیرەیی نەبوو، چونکە بەو شێوەبوون.

**سێیەم:** چەند ژنی، کە هۆیەکی زۆر باشە بۆ چارەی قەیرەیی، چونکە لە کاتێکدا (١ پیاو بەرانبەر بە ٨ ژنە) چاکترین چارە چەند ژنیە، بەڵام بە داخەوە زۆربەی زۆری ئەو رێخراوانەی بە ناو داکۆکی لە ماڤی ژنان دەکەن لە بری ئەوەی لە خەمی ژناندابن و چارەی قەیرەیی بکەن، دێن دژایەتی ئەو خاڵە دەکەن و هەوڵیش دەدەن بریارێك لە پەرلەمان دەربچێت قەدەغەی چەند ژنی بکات، کەچی لەگەڵ ئەوەی دژایەتی چەند

ژنیش دەکەن، دەبینین هەر لە ناو خۆیان گاڵتەیان بە قسەی خۆیان دێت و زۆرێکیان کە لە پلەی بەرزیشدان سەر بەهەوێ شوودەکەن.

کەوابوو خوشکی بەڕێز بیر بکەرەوە و بزانە چ شتێك لە بەرژەوەندی تۆ دایە.

خوشکی بەڕێزم تەنها خوای (الرحمن و الرحیم) بەرژەوەندی تۆ دەزانێت، ئەر تۆی دروست کردووە و دەزانێت چی بۆ تۆ باشە، نەك مرۆڤێك کە بڕیارێکت بەسەردا بدات، لە هەمان کاتیش خۆی قسەی خۆی پەیڕەو ناکات و دەزانێت بڕیارێکی بێ کەلکە.

جا من لێرەدا ئامۆژگاری خوشك و برایان دەکەم بەم شێوەیە:

## ئامۆژگاریم بۆ پیـاوان:

برای بەڕێز ئەگەر بە نیازی ژنی دووەم یان سێیەم بهێنی.. ئەوە بڕوانە بزانە دەتوانی مافی خێزانی یەکەمت پێشێل نەکەی؟! یان دەتوانی مافی هەر دووکیان بە یەکسان بدەی؟! یان دەتوانی لە هەموو ڕوویەکەوە ڕازیان بکەی؟!



که‌وابوو برای به‌ڕێزم ته‌نها له‌به‌ر ئاره‌زووی نه‌فست خۆت تووشی شه‌رمه‌زاری دنیا و قیامه‌ت مه‌که‌، چونکه‌ پێغه‌مبه‌رﷺ باسی ئه‌و که‌سانه‌ ده‌کات که‌ خاوه‌نی دوو ژنن ده‌فه‌رمووێ:

«مَنْ كَانَتْ لَهُ امْرَأَتَانِ، فَمَالَ إِلَى إِحْدَاهُمَا، جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَشِقُّهُ مَائِلٌ» صحيح: ( صحيح الجامع: ٦٥١٥ )

واته‌: هه‌ر که‌سێك دوو ژنی هه‌بێت، عه‌داله‌تیان له‌ نێواندا نه‌کات، زیاتر ڕوو بکاته‌ یه‌کێکیان، ئه‌وه‌ ڕۆژی قیامه‌ت دێت به‌ خواری ده‌ڕوات.

## ئامۆژگاریم بۆ ژنی یه‌که‌م:

خوشکی به‌ڕێز کاتێك زانیت پیاوه‌که‌ت به‌ نیازی ژنی تره‌ و پێویستیه‌تی، ده‌شزانی پیاوێکی خراپ نیه‌ و مافی جه‌نابت پێشێل ناکات.. ئارام بگره‌ له‌سه‌ر بڕیاره‌که‌ی، ئه‌وکات خودا پاداشتت ده‌داته‌وه‌، چونکه‌ ڕه‌نگه‌ به‌و کاره‌ی له‌ کاری خراپ به‌ دوور ده‌که‌وێت، تۆش خێره‌که‌ت پێ ده‌گات.

خوشکی به‌ڕێز نه‌که‌ی.. نه‌که‌ی.. که‌ زانیت پیاوه‌که‌ت ژنی دووه‌م ده‌هێنێت، ئه‌وکات تۆش داوای ته‌لاقی لێ بکه‌ی، چونکه‌ پێغه‌مبه‌رﷺ له‌ باره‌ی ئه‌و ئافره‌تانه‌وه‌ که‌ به‌ بێ هۆ داوای ته‌لاق ده‌که‌ن

دەفەرمووێ: «(أَيُّمَا امْرَأَةٍ سَأَلَتْ زَوْجَهَا طَلاَقًا من غَيْرِ مَا بَأْسٍ فَحَرَامٌ عَلَيْهَا رَائِحَةُ الْجَنَّةِ)» صحيح: [ صحيح الجامع: ٢٧٠٣].

واتە: هەر ئافرەتێك بە بێ هۆ داوای تەڵاق بكات، ئەوە بۆنی بەهەشتی لێ حەرامە.

**ئامۆژگاریم بۆ ژنی دووەم:**

بەڕاستی ناحەزانی ئیسلام زۆر شتی نابەجێیان لە مێشكی ئەو ئافرەتانە چاندووە، كە بە نیازن سەر بە هەوێ شوو بكەن، بەوەی كە ئەوە پێشێل كردنی مافی ئافرەتە، بەڵام خوشكی بەڕێزم تۆ گوێ مەدە بەوانە، چونكە ئەوانە تەنها دەیانەوێ بازرگانیت پێوە بكەن بۆ ئەوەی پلەیەك بەرز ببنەوە، یان بۆ ئەوەی پارویەكی چەوریان چەنگ كەوێت.

ئافرەتێك ببێت بە خاوەنی پیاوی خۆی زۆر باشترە لەوەی لە ماڵی باوكیدا بمینێتەوە، دواتریش لای براژن بكەوێت، دواتریش لە یانەی بە ساڵاچوان بكەوێت.

كەوابوو ئامۆژگاریم بۆ ژنی دووەم..

خوشكی بەڕێز كاتێك كەسێك دێتە داوات، نەكەی.. نەكەی.. هەرگیز نەكەی.. مەرجی تەڵاقدانی ژنی یەكەمی لەسەر دابنێی، چونكە پێغەمبەرﷺ لە بارەی ئەو ئافرەتانەوە كە بە بێ



هۆ داوای تەڵاق دەکەن دەفەرمووێ: «لاَ تَسْأَلِ الْمَرْأَةُ طَلاَقَ أُخْتِهَا لِتَسْتَفْرِغَ صَحْفَتَهَا، وَلْتَنْكِحْ... » صحيح: [ صحيح الجامع: ٧٣٠٦ ].

واتە: دروست نیە وحەرامە لەسەر ئەو ئافرەتەی بۆ ئەوەی رێی شووکردن بۆ خۆی خۆش بکات مەرجی تەڵاق لەسەر ئافرەتێکی تر دابنێ.

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|




**بە پیشتیوانی خوای گەورە تەواو بوو.. ئەوە منەتی خوایە لەسەر منی بێ دەسەڵات.. خوایە سوپاست دەکەم بۆ ئەو زانستەی پێتداوم.. خوایە ئەم کارەم بۆ بکەی بە قورسای لا تەرازوی چاکەم..**

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه اجمعين

## بەرهەمە چاپکراوەکانی تری نووسەر:

١. ناوە جوانەکانی خوای گەورە بە بەڵگەی قورئان وسوونەت.
٢. هۆکارە بەسوودەکان بۆ ژیانێکی ئاسوودە.
٣. زایەڵـــەی شادی.
٤. لاوان کاتی نەهاتووە بگەڕێینەوە؟!
٥. کێ دەکەی بە هاوسەری ژیانت؟
٦. ئاوێتەی دڵ/ الفوائد.
٧. خۆشـــەویستی، خوێندنەوەیەکی شەرعیانە و سەردەمیانەوە.
٨. ڕێبەری نوێژەکان.
٩. تەمەنی زێرین.. با بە فیرۆی نەدەین. ئەم کتێبەی بەر دەستتە.
١٠. ڕاستیەکی ونبوو!

## زنجیرە چیرۆکی ڕاستەقینە پێك هاتووە لە (١٠) چیرۆك:

١. کاسێتێکی ڤیدیۆ ژیانی لێ تاڵ کردم.
٢. گەنجێـــك ئابڕووی پاراستم.
٣. ڕۆڵــــە شیرینـەکەم.
٤. ســارا دوای (٢٢) ساڵ لە گوناھ و تاوان.
٥. خۆی و خێــزانی دۆڕانــد!!
٦. چی بچێنی ئەو دە دووریـــەوە.
٧. سێ کورتە چـــــیرۆك.
٨. مۆبایل ژیانی لێ تاڵ کـــردم.
٩. خوشـــکم بۆ ئابڕووت بردم!!
١٠. داب و نەریت بەرەو گۆڕیی بردم.

